عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەگورجی دووڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، تەنانەت لەدڵی خۆمەوە دەم گوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحا دەکەوێ! (ت/١/٣٠٦-ش/د/ن).

## کردنی نوێژی چێشتەنگاو لەماڵەوە (لەئاوایی دا)

٥٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاث، لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ.

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویستم (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ ئامۆژگاریەی کردوم، هەتا دەمرم تەرکیان ناکەم: لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبم، وەهەموو ڕۆژێ بەلایەنی کەمەوە دووڕکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم، وەهەموو شەوێ لەپێش خەوتندا نوێژی وەتر بکەم. (ت/١/٤٨٥-ش/د/ت/ن). (الحديث: ١١٧٦ فتح الباري).[٥٢٠]

## کردنی دووڕکات نوێژی سوننەتی پێش نیوەڕۆ

٥٨٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ. (الحديث: ١١٨٢).[٥٢١]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز ئەم نوێژە سوننەتانەی تەرك نەدەکرد: چوار ڕکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆوەو دووڕکاتیش لەپێش نوێژی بەیانیەوە. (ت/١-ش/د/ت/ن).

(٥٢٠) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب صلاة الضحى.. رقم: ٧٢١.
(٥٢١) بڕوانە(مسلم: صلاة المسافرين وقصرها، باب: جواز النافلة قائما وقاعدا، رقم: ٧٣٠).

## نوێژی سوونن‌ەتی پێش شێوان

٥٨٥- عَبْدُ اللّٰهِ الْمُزَنِيُّ عَنْ النَّبِيِّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلُّوا قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ قَالَ: فِي الثَالِثَةِ: (لِمَنْ شَاءَ) كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً. (الحديث: ١١٨٣-طرفه في: ٧٣٦٨).[٥٢٢]

عەبدڵڵای موزەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەر بێ) (دووڕکات نوێژی سوننەت، لەپێش نوێژی شێوانەوەبکەن) لەسەری جاری سێهەما فەرمووی: (ئەمەبۆ کەسێکە ئارەزوی کردنی ئەم نوێژە سوننەتەی هەبێ). پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە وای فەرموو، نەوەکو مەردووم بیکەن بەدەستورو وابزانن کەدەبێ هەر بکرێ.

(٥٢٢)لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٣/٨٥ خاتمة حديث رقم: ١١٩٧- المترجمە).

# پێڕستی سەرە باسەکان

تمَّ بِحَمدِ الله